## شیعر

د.نوزاد یحیی باجگر

هەولێر - کوردستان

2021

ناوی کتێب: مامۆستا ئەڵێ
بەرگ: بەرگی سێیەم
نووسەر: د.نوزاد یحیی باجگر
دیزاینەر: سمیه مرادی
بڵاوکراوەی: زانکۆی جیهان/ جیهان پرێس28
چاپ: چاپی یەکەم (2021) هەولێر

بۆ داونلۆدکردنی ئەم کتێبانە بە بێ بەرانبەر لەم ماڵپەرانە دەست ئەکەوێت

www.nawzadbajger.org
www.nawzadbajger.net
chairman@cihanuniversity.edu.iq

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان | وەزارەتی رۆشنبیری
ژمارەی سپاردنی(196)ی ساڵی (2017)ی دراوەتێ

زانكۆی جیهان جامعة جيهان

CIHAN UNIVERSITY

## سوپاسنامە

* بۆ رۆحی دایکم .. و .. باوکم
* و خێزانم .. منداڵەکانم .. نەوەکانم
* و بۆ هەموو عاشقان .. هەمووچەشن

د. نەوزاد باجلر

٢٠٢٠/١٢/١٥

www.cihanuniversity.edu.iq

# د. نەوزاد یحیـی باجـکـر .. لە ئەرشیفی بیـرەوەریمـدا

د. وریـا عمـر امـین

من زۆر لە نزیکەوە د. نەوزاد دەناسم ، چ وەك هاوڕێییەکی دێرین ، چ وەك خزمێکی نزیك.
د. نەوزاد لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە یێکێ بوو لەو ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆستانە کە خولیای خوێندنەوە و نووسینی کوردی و کوردایەتی بوون..خۆشی لە شیعرێکیدا بە بۆنەی مردنی ( سامی شۆڕش ) ـەوە باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکات و دەڵێ:

سامی ..ئەی شۆڕش
بحەسێوە...بحەسێوە...بحەسێوە
لە سکونی موتلەقدا
لە یادمە ١٩٦٥
لە گازینۆی سیروان لە بن قەڵا
گەنجان ... دۆمینە و تاوڵە
ئێمەش کوردایەتی ئازارمان بوو
ملاکی چای ناو پیاڵە
ئاوازی ئەی ڕەقیبمان بوو
کوردستان لە هەولێرەوە پێڕەومان بوو
....
هەر ئەڕۆین .. ئەڕۆین .. ئەڕۆین
ڕێگامان مەرگمانە
دروستکردنی ئاوەدانیی کوردستانمانە

وا بوو لە کولێژی پزیشکیی زانکۆی مووسڵ وەرگیرا و لە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پزیشك ... بەمە نەختێ لە بوار دابڕا بەڵام وازی لێ نەهێنا. پەیوەندی و عیشقی بۆ ڕۆشنبیری و وشەی کوردی بەردەوام بوو.. لە ساڵی ١٩٨٧ خوێندنی باڵای لە زانکۆی بەغداد تەواوکرد و بوو بە پسپۆر لە نەشتەرگەریی دڵدا کە لە بوارە هەرە زەحمەت و سەخت و ترسناکەکانی نەشتەرگەرییە ...ماوەیێك لە بەغداد خەریکی پزیشکییاتی بوو ..پاشان گەڕایەوە هەولێر و ڕووی کردە کارکردن لەگەڵ براکانی.
د. نەوزاد یێکێکە لە خێرخوازە دڵفراوانە پەخشندە هەرە چالاکەکانی کوردستان و شاری هەولێر .. کوردپەروەرێکی جەرگسۆز و دڵسۆزە ..عیشقی بۆ زانست و ڕۆشنبیری و خزمەتکردن و ئاوەدانکردنی کوردستان وای لێ کردووە توانینە ئابوورییەکەی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵ تەرخان بکات و چەند دەزگایێکی خزمەتگوزاری دامەزرێنێ .. دیارترینی ئەمانە زانکۆی جیهانە لە شاری هەولێر ، پاشان لە سلێمانی و دهۆکدا..
زانکۆی جیهان گەورترین و پێشکەوتووترین و شەکاوەترین زانکۆکانی جیهانی سێیەمە..تەلارێکی زانستیی بەرزی سەرکەشە.. گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە بڵاوکردنەوە و بووژانەوە و پتەوکردنی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و وشیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا..

د. نەوزاد وەك من بیناسم مرۆڤێكی لە ڕادەبەدەر چالاك و بە توانینە..مێشكێكێكی دینامێكیی هەیە لە ئەنجامدانی كارەكانی..دەیان دەزگای گەورە بەڕێوە دەبات...ئاگادارم ڕۆژێ بە لای كەمی ١٢ سەعات بێ وەستان كار دەكات و بێ ئەوەی هیچ هیلاكبوونێكی پێوە دیار بێ.. سەرەڕای ئەم هەموو بێ كاتی و سەرقاڵییە لە ڕادە بەدەرەی موچڕكی هونەر و شیعر و ڕۆشنبیری بەری نەداوە و بەردەوام بە گیانیا دەگەڕێ.. كتێبخانەیێكی گەورەی كتێبە كوردییەكانی لە ماڵەوە پێكهێناوە كە بە سەدان بەڵگەنامە و دەسنووسی بە نرخ و دەگمەنی تێدایە... مۆزەخانەی ماڵی فۆلكلۆری كوردەواری و سەنتەری ڕۆشنبیری و دەزگای بڵاوكردنەوە و سەنتەری بەڵگەنامەكانی مێژووی كوردی دامەزراندووە.ئیزگە و كەناڵی تەلەفزیۆنی كوردیی تایبەتیی خۆی هەیە..چالاكەوانێكی ژینگەییە ، بە هەزاران نەمام و گوڵ و درەختی لە چیمەنەكانی زانكۆكە و شوێنی تردا ڕواندووە ..و گەلێ جموجۆڵی تری ڕۆشنبیری و زانستی و كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی. دەستی یارمەتی درێژدەكات بۆ هەر كارێكی ڕۆشنبیری و پشتگیریی دەكات.. لە ڕاستیدا ئەوەی د. نەوزاد بۆ بواری زانست و ڕۆشنبیریی كوردیی كردووە كەموێنەیە . لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام دەخوێنێتەوە و شیعر دەنووسێ و تابلۆ دەنەخشێنێ . تا ئیستا ٦ بەرگی بڵاو كردۆتەوە بە دەرهێنانێكی جوان و چاپێكی قەشەنگ و ڕازێنراو بە تابلۆكانی خۆی. لەگەڵ ئەلبۆمێكی گەورەی تابلۆكانی دەركردووە... شایانی باسە كە هەندێ لە تابلۆكانی بیردەربڕی سەرنجڕاكێشن.

سەبارەت بە شیعرەكانی ، د. نەوزاد بە زمانی كوردی و عەرەبی دەنووسێ ..زۆربەی بابەتەكانی لەبارەی خۆشەویستیی نیشتمان و پرسی ژیان و بوون و مردنە. ئەم شێوازە شیعرییەی د. نەوزاد لە ئەدەبی جیهانیدا باوە و بە Telegramic Poetry (شیعری برووسكەیی) ناودەبرێ.. تێیدا بە یەكدوو دێڕ بە لادانی زمانی و لۆژیكی و دەربڕینی لێڵ و نامۆ سەرنج ڕادەكێشێ. ئەم جۆرە نووسینە لە ئەدەبی كوردیدا بەرچاو ناكەوێ ... شیعرەكانی د.نەوزاد سەر بەم (ژانرەن). سۆز و ناسكی و بیری وردیان لێ بەدی دەكرێ. ئەمە لە لایێك ..لە لایێكی ترەوە شیعرەكانی د. نەوزاد سەرنجێكی زۆری ڕاكێشاوە و زۆر كەس بە دوایا دەگەڕێ .. بە (پێوانەی جیهانی) ش ئاستی هەر شتێك لە هەر بوارێكدا بە پێی ڕێژەی داواكردنیەتی. بە چ پێوانەیێك ئاستی گۆرانییێك یا فیلم یا شانۆ یا كتێبێك هەڵدەسەنگرێت؟ وەڵامەكەی لەوەدایە بە ژمارەی داواكردن و ڕوو تێكردنیان... گەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعرەكانی د. نەوزاد بكەین دەبینین ژمارەیێكی یەكجار زۆر خوێنەر بە پەرۆشەوە لێیان دەگەڕێن ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا هێما و پێوانەیە.

د. نەوزاد گەلێ دەربڕین و وێنەی شیعریی سەرنجڕاكێشی هەیە كە مایەی تێڕامانن و دەچنە بواری جەدەلییەتەوە ..بە تایبەتیی ئەوانەی لەبارەی پرسی فەلسەفیی ژیان و مردنن .. و هەندێ دربڕینی بوێرانەشی هەیە لە بارەی بوون و كردگار كە لە كۆمەڵە شیعرییەكانی (فی اللّه) و (الموت) دا بەرچاو دەكەون. لەوانەی ئیستا لە بیرمە ، كە لە شیعرە عەرەبییەكانییەوە وەرگیراوە:

ئەمەوێ مردن لە مردن تێركەم
تا مردن تێر بێ لە مردن

***

ساڵەها هەوڵم دا وێنەیێك بكێشم واتای نەبێ نەمتوانی

***

پەیژەكانی سەركەوتن بەرەو بێ پایانی
لەوێوە پایانی دەست پێ دەكات

د. وريـا عمـر اميـن

# مامۆستائەڵێ

یان مامۆستا دبێژیت... چ دبێژیت، هەتا نە چییە د ناڤ کەسایەتییا مرۆڤیدا باش فێرنابییە ئەلفوبێیا نیشتمان پەروەرییێ د گێرانا ئاخێ مامۆستا د ئەڤان بەرگاندا دبێژیت ب ستایلەکێ تازە و ب شێوازەکێ شیعری و ب سەلیقەکا زێدە جوان و ب زمانەکێ سادە و ساکار د هەمی ئەڤان پەندێن خوەدا مە دکێشیتە ڤیانا وەلاتی و ڤیانا مرۆڤان، لەورا ب هەستەکێ نیشتمان پەروەری وانەیێن خوە دبێژیت، نە شاعرم نە هونەرمەندم لێ خواندنا من بۆ ئەڤان پەندان مامۆستا هەم شاعیرە و هەم هونەرمەند، بەلکو زێدەتر زانا و ژێهاتی و مێشك دەولەمەندە، جاران مامۆستا وانەیان دبێژیت و جاران وەفادارییا خوە بۆ کەس و کار و عەردێ لێ مەزن بووی، هەڤلێرێ دکەتە ئارمانج و بەردەوام د لێگەریانێدایە بۆ روناهییەکا ئەبەدی، ئەوژی نیشتمان و سەربەخۆیا وەلاتییە، ل ئەڤێرێ جهێ ئاماژێیە بێژین، کو مرۆڤە یێ ئەڤان شیانێن دارایی و بەرنیاسی کو دەولەمەند و پزیشك ب ئەڤی ڕەنگی مال و ملکێ خوە بکەتە د خزمەتا گەل و مللەتی دا، وەکو شاعێرەکێ ژێهاتی و رەوشەنبیرەکێ مەزن و هەر کەسێ بۆ جارا ئێکێ شعرێن دیوانا مامۆستای (ئەڵێ) بخوینیت دێ وەسا هزر کەت زێدە د سادەنە، لێ ب دیتنا من ژ کویراتییا دلی دەردکەڤن، ژ حەزەکا مەزنا ئاخ و وەلاتی دەردکەڤن.
ل ئەڤێرێ دکتۆر (نوزاد یحیی باجگر ) چەندین پەیام ئێن مەزن هەم وەکو هەلویست و هەم وەکو ئامۆژگاری بۆ کەسانێن نیشتمان پەروەر بۆ ئەڤی نەوەیێ تازە کو بزانن ئەڤ سەربەخۆیە و ئەڤ ئارامییە و ئەڤ ئالایە ژ ئەنجامێ شورەش و بەرخودانێ هاتینە.
پەیڤێن شرینێن دکتۆری بکارهینانەکا هونەرییا بلند، هەمی دەربرینێ ژ ڕاستییێ دکەن، نەخاسمە دەمێ دبێژیت:

ڕاستی..... بڵێ
ئەگەر........ بشمری

بەلێ، مامۆئێاڤاهییێ خوە ل سەر ڕاستییێ ئاڤاکرییە، دیسا هەتا مرۆڤ نێزیك نەبیت مرۆڤ نازانیت کو چ ئالی نەماینە دکتۆری ئیشارەت پێ نەدای، هەمی ژی دکەڤنە د چارچوڤێ زانین و زانست و پەروەردێدا و دبێژیت: (خوێندن بەنرخە) بەلێ مامۆستا، هەر چییا تە د ئەڤێ دیوانێدا گوتی یا ب نرخ و بهایە و ئامۆژگارییێن ب بهانە، ئەز دبینم هەر بەیتەکا شعرێ کەڤالەکێ جوانە و یێ کاریگەرە و ژ هەژییە ل هەمی ژورێن قوتابخانا و مالان بهێنە هەلاویستن، تێر بژین و تێر تەمەن بن.

پرۆفیسۆر دکتۆر
ئیبراهیم ئەحمەد سمۆ

# خوێنـەری خۆشـەویـسـت ..

ئـەو کۆبەرهەمـەی بـەر دەسـتت (مامۆسـتا ئەڵـێ)، بەرهەمـی هـزر و بیـری (د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر)ە، لـە شـێوە و ناوەرۆکـی شـیعری ئـازاددا گوزارشـتییان لـێ کـراوە. ئـەم شیعرانە دەچێتـە نێـو خانـەی برووسـکە شیعرە یـا (شـیعری برووسـکەیی Telegramic Poetry یـا وێنـەی شـیعری ، شـیعری وێنەیـی سـەرنج ڕاکێـش . هـۆکاری سـەرنج ڕاکێشـی شیعرەکان بـۆ گەڵێـك هـۆ دەگەڕێتـەوە، بەکورتـی بـەم شـێوەیە شـرۆڤەیان دەکەیـن.

ئـەم کۆبەرهەمـە شـیعرییە (مامۆسـتا ئەڵـێ)، دوای ئەزموونـی شـیعری (فـی اللـە، المـوت، کوردسـتان، پێشـمەرگە، وشـە دەچێنـم، أزرع الکلمـات، زنجیـرە پەرتوکـی کودسـتان لـە بەڵگەنامەکانـی عوسـمانی دا) دێـت، بریتییـە لـە چەندیـن بـەرگ لـە ڕووی ناوەڕۆکـەوە بەرهەمـی تێڕامانـی هـزرن لـە بـواری فەلسـەفەی بیـری مرۆڤایەتـی و لـە تێگەیاندنـی بەرامبـەر لـە پەیامـی هـزردا بـۆ بنیاتنانـی مـرۆڤ و نەشـونوماکردنی وەرگـر، ئەوەیـان لەناوەڕۆکـدا.

لـە ڕوخساریشـدا شـیعرەکان گرنـگ نیـن سـەر بـە چ ژانرێـك بـن، لای ئـەوی شـاعیر شـێواز خۆیەتـی و شـوین پێـی کەسـی پێـوە دیـار نییـە و لـە کـەس ناچـێ خـۆی نەبـێ، هـەروەك ڕەخنەگـری فەرەنسـی (جـۆرج بۆفـۆن) گوتەنـی: مـرۆڤ خـۆی شـێوازە. لـەم شـیعرانە و سـەرجەم شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دا هەسـت بـەو بۆچوونـە ڕەخنەییـەی شـێوازی هونـەری گوزارشـتکردن دەکەیـن.

لەکاتێکـدا لـە ئەدەبیاتـی مرۆڤایەتیـدا نموونـەی شـیعری (جـاك بریفـەر وواڵـت ویتمـان و شـیعری هایکـۆی یابانـی) و لـە شـیعرو ئەدەبیاتـی کوردیشـدا شـیعری چوارینـە و پۆسـتەرە شـیعر و برووسـکە شـیعر سـەر بـەو ژانـرەن کـە (د. نـە وزاد یەحیـا باجگـر) شـیعرەکانی بەلادانـی زمـان و دەربڕینـی لێـڵ لـە هەنـدێ گوزارشـتدا سـۆزو ناسـکییەکی دیکـەی بەخشـیوە، سـەرباری بوێـری لـە دەربڕیـن نووسـیندا و نەهێشـتنەوەیان بـە ناکامـی لـە نێـو نـاخ و زاردا.

بوێـری و سـادەیی لـە دەربڕینـدا گـەر خاسـیەتی هونـەری شـیعری ئـەو بێـت، مەبەسـت لێـی لای خـودی د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر چ لەشـیعرەکانی یـا تابلـۆ هونەرییەکانیـدا ئاسـوودە بوونـی نـاخ و بیـرە لـەو جەدەلییاتانـەی کـە هـەر دەبـێ گوزارشـتیان لـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم هەژانـەی نـاخ و هزریـش لـە مێـژە گوتویەتـی:

نە شاعیرم، نە هونەرمەند

مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

بەگشـتی ناوەرۆکـی شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دەچێتـە نێـو بابەتـی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ نیشـتیمان، بـۆ زانسـت و تێکۆشـان و بنیاتنانـی خـود و پێگەیشـتن لـە تێگەیشـتندا، پرسـی ژیـان و مـەرگ و مانـەوە لـە نەمرییـدا بـە کار و کـردەوەی چـاك، هـزری داهێنـەر و بنیاتنەرانـە، نابـێ ئـەوە لەبیـر کەیـن لای ئـەوی ئەفرێنـەر هەمـوو شـتەکان واتایـان هەیـە: ئەوەشـیان ترۆپکـی گەیشـتنی بـە مانایـە بـە مەبەسـت، سـەیرکەن چەنـد جـوان گوزارشـتی لـە بـێ مانایـی کـردووە:ـ ساڵەها هەوڵمـدا وێنەیـەك بکێشـم واتـای نەبـێ، نەمتوانـی.

د. محەمەد خدر مەولود

زانکۆی جیهان

هەولێر ٢١-١٢- ٢٠١٦

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

نە شاعیرم نە هونەرمەند
مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

د.نوزاد یەحیا سعید باجگر

# مامۆستا ئەڵێ

چاوەکم ... هەڵکۆڵن
چاوەکم ... لە قین هەڵبڕن
ئینجا ... ئارەزووی مێشکم هەڵدڕن
بزانن ...
چیمان ... پێویستە

2/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

جوان ... جوانڕۆیانم ... ڕۆ
شەوان ... شەوی بێ مانگم ... ڕۆ
دەمان ... دەسەڵاتی لاویم ... ڕۆ
سامان ... سودمەندی مەندانم ... ڕۆ
هەی ... ڕۆۆ ... هەی ... رۆۆ
هەی ... ڕۆیە
جوانە مەرگی ... پێشمەرگە
خەڵاتی ... مرۆیە

2/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی شەو ... شاهد بە .. بۆ ...
هەموو ... ئەوەی هەیتم
دام .. بە ... ئەو
بەڵام ... عزەتی نەفسی ...
ڕازی نەبوو ... ببێتە خەو
خەو ... بێتە ... دی
بۆ ... دەرمانی ... دیدەوانی ئەو
ئەوەی ... هەم بوو
دام بۆ ئەوەی ... خەونەکانی نەبێتە ... خەو
ئەوەی ... هەی بوو
دای بۆ ئەوەی ... ڕۆژم نەبێتە شەو
ئینجا ... ماینەوە ...
لە سنووری ڕۆژ .. و .. شەو

9/11/2015

هەولێر / ماڵ دریێم ستی

پێشمەرگە ...
به فەخرەوە ... ئەنووسم بۆ پێشمەرگە
به ... مەرەکەبی مێشکم
هەرچی پێشمەرگە کردوویەتی ...
ئی خۆیەتی
زۆر بچوکم ...
کە لە ڕێزیان ... بنوسم

10/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

پێشمەرگە ... ئەڵێ
هەڵئەستم ... لە گۆڕم
دێمەوە ... ئەفڕمەوە
وەك ... زیندوو
زندی ... دەبمەوە
من زیندووم .. لە زیندانی ئازادی
زیندووم
ئەفڕم ... لە گۆڕم

10/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

پێشمەرگە ... ئەڵێ
ئاواتمە ... وەك من بن
لە مردن ... زلتر بن
لە ژیان ... جوانتر بن
ئینجا ... پێشمەرگایەتیم ...
دێتە دی ..

10/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

پێشمەرگە ئەڵێ
لە شیعر .. و .. دوان
قافیە .. و .. تەرازوو
ئەدوا ...
بەڵام ... لە شیعری پێشمەرگە
هەست ... ئەڕوا

10/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

پێشمەرگە ئەڵێ
توانای ... بیر ... و .. بڕوا
جوانی ... خۆبەخشی ژیانی لێ ئەڕوا
زیندووی ... خۆ فیدائی
مردن ... ئەخوا

10/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

پێشمەرگە ئەڵێ
شەوم ... کردە ... ڕۆژ بۆتان
خوێنم کردە ... مۆم بۆتان
ڕەوشتم کردە ... ئاوات بۆتان
بۆتان ... بۆتان ..
بوینە پێشمەرگە ... بۆتان

10/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

پێشمەرگە ئەڵێ
وەرئەگرم ... دوا هەناسەم
مۆرە ... لێوم ... ساردە دەستم
جوان ... و ... سەوز ... ئەتبینم
کوردستان

**10/11/2015**

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

برِوا ... بیرەوانی بیری برِوایە

22/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هاوتای هەوێنە
هەتا ... هەتایە

22/11/2015

هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... ئازادی ئازادیە
دروستکەری بیرۆکەی ... خولقاندنە
خولقاندن ... ئەبێتە زانست
زانست ... خزمەتی مرۆڤە
خزمەت ... بۆ خۆشی خۆشەویستانە
... بیرۆکەی هونەری ...
ئامانجی خۆشی خۆشەویستانە

23/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

هونەر ... هاتمە دەرگات
ڕزگارم کەی
لە قین .. و ... تەنیایی
سەربەستم ... کەی
بە ئاگرت ... ساردم کەی
بۆ خولقاندنی ... هونەری ...
هەویرم کەی

23/11/2015
هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هونەر ...
هەویری هەوێتی هەماهەنگیە

23/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مـامـۆسـتا ئـەڵـێ

هونەر ...
پەنگری ناخت ...
فێنك ئەكات

23/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هونەر ...
هەڵمەتی هیممەتی هیمدادت
هەنگین ... ئەکا

23/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

هونەر ...
هەو ... نیە لێرە
دیار ... و ... دار نیە لێرە
گوناە ... و ... سوکە لێرە
بۆیە ...
نە دیار ... ین .. و .. نە سەردارین
ئێمە نازانین ... گوناهین
هەتا نازانین ... بۆ گوناهین
دەبێ ... ئێمە چی بین لێرە

23/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئـەڵێ

هونەر ...
هاودیانی ... هاوڵاتی
هەربردی ... و ... هەڵاتی
هەنجەتی ... بۆ ... نەهاتی

23/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ...
دەرمانی دەربەدەریە لە ناوخۆو
لە دەرەوەی خۆ ...

24/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر
پەرژینی ... سەربەستیە
مساحەی سەربەستی ... هونەر
ترلیۆن × ترلیۆن سەربەستی ؟
1 000 000 000 000 × 1 000 000 000 000
$1^{12} \times 1^{12} = 1^{144}$

24/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی ... هونەر مەند
چۆن ... بووی مەند
بەندی ... مەندی مەندان
لە ناو ... خاك ... هەوا ... ئاگر .. دۆزەخی
هونەرمەندان
ئاواتت ... پاش ئاوات
بەختیاریت ... پێش بەختیاریان
کەی بەختیاری ... نەگەیشتە ئاوات
ئاوات نەیتوانی ... ببێتە بەختیار
ئینجا ... هونەرمەندی
هەڵئەقوڵێ لە ناخت
ئەی هونەرمەند

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

هونەرمەند ... کاری دڵ بەند
پەسەند .. لە ناوخۆت
ئاگر سوتاو ...
هەست داماو ...
رزگاری ڕوخاو ...
ئەخوڵقێنێ ... هونەری بێ .. تاو

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگا ... هونەرمەندی ڕەسەن
لە ناوم ... بڕوابایە
ئینجا ... بمردمابایە

25/11/2015
هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هەوێتی هەوە
هەولێری ... هانە
هێوێتی .. هەویری هونەرە
لە مان .. و .. نەمان
پێویستە ...!؟

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هێمنی هەوایە
هونەر ... هێمنی هەوایە

25/11/2015
هەولێر / ماڵ دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ...
هەڵەی ... هەبوون ...
و ... نەبوون

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هۆگری
هەڵمەتی ... نە بوون

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئەڵێ

هونەر ... هەنگینی
دروستکەرانی ... هەنگ

25/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

هونەر ... هەوێنی هاندانی
هەماهەنگی ... هەموو ... هەمووتانە
هەموو ... هەموو
هەموو .. بێ هەمووتانە

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئەڵێ

## هونەر ... ئاوێنەی ڕوناکیە

25/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... خەونی نەستەقی
نەستەقایەتییە
لە خەون .. و .. لە خەیاڵ .. و .. لە بێ خاوەن

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... خاوەنی خەونی
بێ ... خەونانە

25/11/2015
هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هەو ... نیە
قاسپە ... قاسپی کەو نیە
ئامانجی سوودی .. ڕزگاری مێشکە

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هۆ .. هەو ... هۆ
هەموو ... هایەکان
هۆیان ... بووە ... گۆ

25/11/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

هونەر ... بەرژەوەندی هانی هەوای
پەیوەندییەکانی ... ژێر ئاسمان
و ... دەسەڵاتەکانی سەر خاکان
بوونە سومبولی دەسەڵاتی
خۆشەویستەکانی ... خوا

25/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... هەتا ... هەتایی نیە

25/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

مزگەوت ... مرد
سەلیب قوت کرا
ئەستێرەی سلێمان
سێکوچکەی لێ دەرهێندرا
کۆنفشیۆس ڕدێتی تەڕاش کرا
بودا لاواز بوو
خەندەی هەڵوەرا
هندۆس ... ڕدێن ...و .. سمێڵ.. و .. پرچیان
بە مووسی تراش برِ ... تراش کرا
بە کوشتنی ... بێ گوناهێك
کاك تاهیر إلیچ ... لە ماد دیار کرا

29/11/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

نامرم ... نامرم
هەتا ... نەیبینم
ئەگەر ... مردیشم
نامرم ... نامرم
هەتا .. کۆماری کوردستان ئەبینم

2/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

باپیرێکی ... تامەزرۆی دوانی نەوەکانم
منداڵانی ئازاو ... سویدی ئەمدوێنن
کچەکانی پەری ... بە ئەڵمانی
کوڕی دانا ... بە هۆڵەندی
گەرچی ... چار زمان ئەدوێم
نامدوێنن ... تەنیا ... بە چاو .. و .. هەست
ئەیان بینم ... پر ژان ... و .. کەست
چی ... بوو .. ئەم جەنگە
جەنگ ... جەنگی ... لێ ڕوا
ئەم ... پلانە ... لە کێ دانرا

4/12/2015

هەولێر / ماڵ دریێم ستی

خۆم ... و ... خۆمەکانم
شەرمەزاری ... دوو ... ڕووەکانم
هەرچی ... لە دوو ڕوو ..
زیاترم دۆزیتەوە
بۆ .. ئاسانکاری کارەکانم
و ... پڕۆسەی ژینەکانم
نەستەق نیە ... ئەزانم
بەڵام ... بێ چارەم

8/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

له كوردستان .. پیاو .. ئافرەت
شەرواڵ ... له بەر ئەكەن
تفەنگ ... له شان ئەكەن
هەردووكیان ... پێكەوە كار ئەكەن
وا ... دیارە ... پێكەوە ژیان
ژوان ... ئەكەن

8/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

لە شەرمەزاری
دوو ... ڕووەکان
شانزە ... ڕووم بەکار هێنا
بۆ ... داپۆشینی شەرمەزاریم

8/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئەڵێ

ڕومەتم ... سۆر
چاوم ... کۆر
گوێم ... کەڕ
زمانم ... لاڵ

8/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

له شەرمەزاری ... هەستەکانم
خۆم شاردەوە ... له ناو خۆم
هەتا بسوتێنم ... ڕوونی خۆم
ببمه ... مۆم .. بۆ خۆم
خۆم .. ببم بۆ خۆم

8/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

هەتا ... بتوانم
بسوتێنم ... ئاواتی خۆم
بۆ ... ڕوناکی .. ناخی خۆم
ئینجا ... ئەبمە مۆم
بۆ ... خۆم
لە ناوەوە ... و ... دەرەوەی خۆم

8/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

برۆن ... لێم گەڕێن
لە سەربەستی ... بەڕەلایی
خۆم .. و .. خۆمەکان بژیم
وەك ... ئێوە
منیش ... حەقم ... هەیە

8/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

منیش ... زەردەشت
زارو ... دەشتم
کردە ... فۆلکانی زانین
ئێستاش ... بڕوا نەکەن
لە داهاتوودا ... ئەکەن

8/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

## مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

منیش ... شاقووڵی
ڕاستەوخۆ ... دێمە خوارەوە
بە هاتنە خوارەوەم
خوار ... و ... خیچ راست ئەکەم

8/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

منی ... شەقووڵ
شەق ... و ... قۆڵا
شەق ... دراوە
هەموو ... شتمان لە سەر درۆ ... هەڵبەستراوە
هەتا درۆمان ... بۆتە شەقووڵ

10/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

خۆمان ئەكەین ... بە شەقووڵ
نازانین شەقووڵ ... بۆ ڕاستە

10/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

شەقووڵ ... هاتنەخوارەوەی سەنگە
بۆ ... جاذبیە
لە (+) بۆ (–) بۆیە هێڵی ڕاستە
لە سەرەوە .. بۆ .. خوارەوە
ئایا شەقووڵ ... ڕاست ئەبێ
لە خوارەوە ... بۆ سەرەوە
هەرگیز ... نا .. نا

10/12/2015
هەولێر / ماڵ دریێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شەقووڵ ... ڕاستە ..
ڕاست ... کەرە ...
ڕاستەیە...
ڕاستەوانە ....
ڕاست بەندە.

10/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شەقووڵ ... بینای ڕاست ئەکا
مرۆڤ ... دروستی ئەکا
... شەقووڵ = مرۆڤ

10/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شیخ ... سەنعان
شیخی ... شاخان
سەنعانی ... سەنعاتکاران
سەنعاتی ... خۆشەویستان
خۆشەویستیت .. لە هەشتا تەقی
ئی من لە ... هەژدە سالآن

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

## مامۆستا ئەڵێ

شێخی ... سەنعان
شێخی ... شێخانی مۆخانم ڕۆ
شێخی ... سەنعانی خۆشەویستانم ڕۆ
شێخ ... لە هەشتایە کان ئازاد بوو
هەشتا ساڵ ژیا
بۆ ئەوەی ... دەرباز بی
وە ئەگەر ... ڕۆژێك بێ ..
هەر چاك بوو ... وێرا

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخ سەیری بەفر .. و .. ماست فرۆش
لە بازاڕی ناو قەیسەری ... پەرۆش
شیعرەکانی شێخی ... ئەنۆش
تامی ماستی دەشتی هەولێری ئەکرد
شیعری مەقامی شێخ سەنعانی ئەجۆش
من لەوێ ... لە بازاڕی هەولێر
دەربەدەری دەروونم ... دڕاند

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخی ... شێخانی مۆخانم
گەیشتمە قەناعەت .....
کە یەزدانم خودای گەورە ... خۆشەویستیە
بە نەزانینم ... و .. بە زانینم

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخەکەم ... شێخی سەنعانەکەم
هەموو ... سەنعاتکارانەکەم
کارم ... لە دەرەوە... و ... لە ناوەوەی
کارەکانم
شێخایەتی ... لێ دروست ئەکەم
نەوزادەکانی ... لێ دروست ئەکەم

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخی ... شاجوانی شاخ
هێزی تەسەوفی ... سەنعاتی ساخ
لە شاخ ... بەرز بوون بوو .. ناخ
ناخ چووە ... ناو شاخ
شاخ دامەزرا ... بە مەڵبەندی ناخ
هەموو ... سەنعاتەکان
ناخیان ... بووە شاخ

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شێخ ... سەنعان ئەڵێ
خۆشەویستم ... ئازاد بوو
کە بڕوام ... ئازاد بوو

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئەڵێ

شێخ سەنعان ... ئەڵێ
ئاین ...
بۆ خۆشەویستیە ..

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شێخ ... سەنعان ئەڵێ
هیچ ناڵێم ... بۆ ئەوانەی
خودا ... ناناسن
ئەوان ... ئەوان ... ؟!

19/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخی ... سەنعان
بووە ...تامەزرۆی جوان ... و ... کریستاڵ
چونکە لایدا ... بۆ خۆشەویستی
پێش ... گەیشتنی ... بە بەهەشت

19/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شێخی ... شێخانم
شێخ ... سەنعانم ... ڕۆ
تۆبەی ... هەشتاساڵم ... ڕۆ
وا دەبینم ... خۆشەویستی
گوناهی ... گچکە دەپۆشی
ئەگەر ... نا ... سەنعان
چۆن ... دەوێری
خەرمانی ... مەحەببەت بڕوخێنی

20/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

شێخی ... سەنعان
بە مەحەببەت
بووە ... قەڵغانی ..
لە هەموو ... زەمانێ
بۆ هەموو ... زمانێ

20/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

شێخی ... شێخایەتی
لە دەستووری ... ئاین
مەحەببەت ... و ... ڕاستی .. و .. ئارامی
شێخایەتی ... بۆ دونیا نییە
بۆ سەروەری خۆشی مرۆڤ ..
بێ ... یاساییە
لە دونیا ... و ... قیامەت

20/12/2015
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

شێخی ... شاخۆوانم
مامۆستای ... سەنعانم
وایان زانی ... خۆشەویستیت
دژی خۆشەویستانم
وانیە ... مەحەببەتچیەکان
سەروەری ... خۆشەویستانم
پیغەمبەران .. محمد ... و .. عیسا ... و ... موسا
خۆشەویستی خۆشەویستەکانن
سەنعان ... و ... هەزارانی دی
لە ... گەڵ ... پێغەمبەرانن

20/12/2015

هەولێر / ماڵ درێم ستی

لە ... دەرەوەی وڵات
ئەزانم .... چەند دەربەدەرم
لە ئازادی ... بێ زانیین
لە فڕینی ... ناو نەزانین
لە دەرەوەی وڵات
ئەزانم ... چەند دەربەدەرم
بۆیە ... وڵاتم ئەبێتە
خەڵاتی ... کۆرەکان

2/10/2015
اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

لە دەرەوەی ... وڵات
فرمێسکم ڕێشت
لە نەزانینی نرخی ... وڵات
چی ... وڵات ئی منە ... چی هەڵات
دەربەدەری ناخ ...
هیجرەتی ... دار ... و ... باغ
خاك .. و .. بەرد .. و .. شاخ
لە ... کوردستان
شەڕە ... لە سەر دابەشکردنی
ئێمە ... شۆڕشگێڕین بۆ دین
بۆ .. یەکگرتن ...

2/10/2015
اسطنبول

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سامانی ... جیهان
مانی مان
بۆ بەختیاری هەرمان
ئەبێتە سومبولی خودا ناسان

30/9/2015
اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

سامانی .... جیهان
مانی ... جوان
بۆ خۆشەویستی ژیان
ئەبێتە داخوازی
سەروەری رۆحی سامان

30/9/2015

اسطنبول

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سامانی ... جیهان
مانی هەستی ڕەنجبەران
بۆ کاری کۆکردنی دەربەدەران
ئەبێتە داخوازی شۆڕشگێڕان

30/9/2015
اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

سامانی ... جیهانی
نەمانی درۆزنان
بۆ ڕووتکردنی نەزانان
ئەبێتە ڕووت کردنی سیاسیان

30/9/2015

اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

سامانی ... جیهان
جیهانگیری ... جیهان
بۆ ... زانستان
ئەبێتە زانینی ... خۆبەخشان

30/9/2015
اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

## سامانی ... جیهان
## گلۆبالیزەیشنی ... مرۆڤان

30/9/2015

اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

جەنگاوەرین ... جەنگی سپی
هەرچەندە .. جەنگەکان پڕ خوێن بوو
لە جەنگ ... خوێنمان
سپی بوو ...

27/1/2015
قبرص

که ... ئەجەنگین
لە جەنگ .. و .. لە ئاوەدانکردن
بۆ .. خۆشی .. بەختیاری
ئەجەنگین
ممکنە ... نەزانین
بۆ .. کێ .. ئەجەنگین
زۆر جاریش .. جەنگ
دەر بەدەر ئەبێ ...

27/1/2015
قبرص

# مامۆستا ئەڵێ

که ... کورد .. ئەجەنگێ
هەموو شێوازی جەنگ
ئاودیو ... دەکا.
له سوور ... 57 ڕۆژ
بەرامبەر ملیۆن سەرباز
ئەجەنگێ
ئەبێ ... بیرو بڕوای
پێشمەرگه ..
بخوێندری
له فەرهەنگی ... سەربازی

27/1/2015
قبرص

# مامۆستا ئەڵێ

ئازاد .. و .. سەربەست
سەربەست ..و.. ئازاد
پەیوەندیان ... جیاوازیان ..
چیە ... ؟!

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

تەفاصلی ... ئازاد ... سەربەست
بدۆزیتەوە
ئازادی ... نا سەربەست
نەیدۆزیتەوە
سەربەستی ... نا .. ئازاد

19/1/2015
لندن

ئازادی ... سەربەستی
جیایە .. لە
سەربەستی ئازادی
نە ... ئازادی سەربەستیە
وە ... نە سەربەستی .. ئازادیە
مێشکی خۆت ڕاگرە
فکر لە هیچ مەکە
تەنیا ... جیاوازی
ئازادی سەربەستی
و سەربەستی ئازادی

19/1/2015
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری ... ئاسمان بکە
کە ئەتوانی ... ئارامی ئاسمان ...
هەست بکەی
جوڵانی ... نەجوڵاو هەست بکەی
خۆشەویستی بڕوێتی
لە ئاسمانیش ... ئەڕوێ

3/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری ... ئاسمان بکەن
کە ... لە ئاسمان ئەڕوانن
بێ سنووری هێز ... ئەبینن
جوانی ... خولقاندن ئەبینن

3/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری ئاسمان بکەن
کە چاوتان ... نەبینێ
بە هەستی ... خولقان .. لە ناو مێشکمان
چاپ کراوە
پێویستی ... هەستمانە
بۆ ... هەست کردنی

3/7/2015

# مامــۆستا ئـەڵـێ

سەیری ئاسمان بکەن
کە لە ناختان ... ناخ کراوە
چونکە ... بە ناخمان
ئەگەر ... ئاسمان ببینین

3/7/2015

موسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری ئاسمان مەکەن
ئەگەر ... هەستی دروستکردنی خودای
گەورە .. نەبێ
لە ناوی ناوتان
چونکە ... هەستی پێ ناکەن

3/7/2015
مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستای جەرگ سوتاو
دەردی ژانی نەماو
مانگی هێزی ... زانستی دروستکراو
هەموویان ئەبنە ... بناغەی چاو

**2/10/2015**

**اسطنبول - أستقلال**

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری ئاسمان کە
هەست نەکراوە ... نادیارە
لە بێ سنووری ... ئاشکرایە
سەنگی قورسی نەماوە
لە ناوخۆ ... و ... لە دەورەی خۆ سوڕاوە
هەموو ... بە یەکتر
هەڵبەستراوە

3/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

(1)

سەربەستی ... سەربەستین بێ ...
سەری پێوە نیە
دەردی دەرمانی نیە
سەری ... سەنگەری
پێویستی نیە

# مـامـۆسـتا ئـەڵـێ

(2)

سەربەستی .... بە ڕاستی
ئادەستی ... هەستی
سەربەستانە
لە دەروونیانە
لە ڕەوشتیانە
لە ڕوانگایانە

# مامۆستا ئەڵێ

(3)

سەربەستی ئەوە نیە

سەری سوڕمایە

لە بەڕەلایی سەربەستی

سەگی بەڕەلا

خاوەنی نیە .... خۆشی خاوێن نیە

# مامۆستا ئەڵێ

ناوم ... لە ناو ناوان سڕاوە
لە سەر بەردی فۆلکان
بە سەهۆڵ ... هەڵکەندراوە

25/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئەحمەد کایە ..... وەك بەرد
ئەسوتێنێ بارووود
بە هێزی خۆشەویستی هونەر
ئەژیێنی سەروەری سەحەر

15/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

له ژیان چاوەڕوانی مردن بووم
بەڵکو ... ئەبینم
له مردنیش نەمدیتی
چاوەڕوانی ژیانی دیتنتم

25/11/2015

# مامـۆستا ئـەڵـێ

له ژیان به ساغی حەلال بوی
له مردن ....لێت ئەگەڕێم له ناو مردن
مردن زیندو ئەکەمەوە
بۆ .... ژیانی
خۆشەویستیت

15/11/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

له دووتم ..... له دووتم
لێت ئەگەڕێم
له ژێر سێبەری دارەکانی
بەهەشت لێت ئەگەڕێم
له قرچه قرچی سوتانی
لەشم له دۆزەخ
هەر لێت ئەگەڕێم

30/10/2015
Rena_Istanbul

مەلیك هەیتی .. زۆر .. زۆر .... زیاتر
لە زانینو ... تەكنەلۆجیای مرۆڤ
مرۆڤ ... بە بێ عەقڵی بووە مرۆڤ
ئەسوتێنێ ...
هەموو ئەوەی نازانێ
ئەوەی ئەزانێ ... بۆ سوودی خۆی
دیلی ئەكا ... بە سوتاندن

3/7/2015
اسطنبول

# مامـۆستا ئەڵێ

سەیری ئاسمان .. کا
دەرونت فراوان ئەکا

3/7/2015
اسطنبول

بڕوام وایا ... ئەزانم
خوا ...ناسی چیە
جیاوازام ... لەوانەی
بیر .. لە گەورەیی
خوا ... ئەکەن
بە مێشك .. و ... فكری
مرۆڤ

**20/9/2015**

**اسطنبول**

# مامۆستا ئەڵێ

خوای گەورە ... خولقێنەرە
مرۆڤ ... ئاینمان دانا
ئێمە ... بۆ ناسینی
لە مێشکمان .... چاندراوە
پێویستە ... بیچێنێن
ئاوی بدەین
بیدورین
ئینجا ... بیخۆین
ببێتە ... ئینێرگی
بیر .. و .. بڕوامان
بۆ ... خۆشەویستی
وی ... و ... خولقاوەکانی

20/9/2015

(1)

له دەریای .... ئیلهام ئەفڕم
وەك حوشتر ... له بیابان ئەڕۆم
وەك بەكتریا ... خۆم .. به خۆم ئەخۆم
بۆ دەسەڵاتی فڕین ئەڕۆم
به بێ ئەوەی ... هیچ بخۆم

26/11/2015
اسطنبول

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

(2)

لە ... بیابانی ئیلهام بزر نابم
بەڵام ... لە بزر بوونی ئیلهام
هەمیشە ... ون ئەبم

26/11/2015

اسطنبول

(3)

له ... بەهەشتی ئیلهام
بەهەشت ... ئەبێتە ئیلهام
پەریەکانی ... بەهەشت ..
هەشت هەزار .. و .. هەشت بەهەشت
ئەبنە خزمەتکاری
یەك ... وشەی ئیلهام

26/11/2015

(4)

له خەرمانی ... ئیلهام
لێی ... تێر ئەبێ ... مەڕو ماڵات
میرو ... داهات
زیندو .. و .. ماندو
ئەچنه ... ڕەوسەی خەڵات
ئیلهام ... خەرمانه
فەرمانه....
خۆشی ... مانه

26/11/2015

(5)

پیتی ... ئیلهام

بەرد ...ئەسوتێنێ

لاڵ ... ئەدوێتێ

هەستی ... هەست نەکراو ئەڕوێنێ

بۆ ... ئامانج دانی

پیرۆزی ... بیرەوەری ئیلهام

26/11/2015

# مامــۆستا ئەڵێ

(6)

**شانۆی ئیلهام ... چیایا**
**چیای ئیلهام ... مۆسیقایا**

(7)

ئیلهام ... باڵندەی بێ باڵە
ئەفڕی .. لە ناو ئاو
نامری ... لە ناو زوخاو
فڕینی ... لە ناوخۆو
.... لە دەرەوەی خۆ
وەك ئەلیكترۆن ... نیترۆن

26/11/2015

عاشقانی ... عەشقی ناو خۆو
سەر سامانی ... سەرسامی دەرەوەی خۆو
سەرسامی ناو خۆو
عاشقی ... دەرەوەی خۆ
سەرسامی ... عاشقە
عەشقی ... سەرسامە

27/11/2015
انقره

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوانەی لە مردن بە دوام ئەکەون
لە ژیان ... زیندویان ئەکەم
مردن ... ژیان ... ژیان و مردن
دەوامی ... نادەوامن

27/11/2015
انقره

پێی وتم .... بڕۆ سپی
کە ئەتووم دیت .. ڕۆژ هەڵات ..!
بە منت وت ... خەرمانی ژیان
ئێستا ... لە قەبرم ئەتبینم
بۆ کێ ئەڕۆی ... مردن سنورمە
و سنورتە ..... بڕۆ سپی
هەمیشە دێتە لام

27/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

پێی وتم ... مامۆستا
خۆم لە خۆت مارە ئەکەم ... بە هەستا
بە مەبەستا ... هەتا هەتای بەدەستا
وتم ... بژی لە عەشقی دەرونیت
منیش وەك تۆ ... عاشقی
عەشقێکی ... نەبیندراوم

27/11/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

دەستورێکی ... کەلتور .. و ... میلیە
زبارە .. و .. خەرمان کۆکردن
خانوو ... دروست کردن
هەتیو ... بە خێوکردن

27/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

دەستورێکی چەند خۆماڵیە
نوێژێك ... لە سەر بەرماڵی
شەش تەراخی ... چنراو
لە ژێر ڕەشماڵی ... قەرەچوغ

27/11/2015

## مامۆستا ئەڵێ

دەستورێکی قەشەنگە
ڕێز لێنان ..
لە هەموو ... دایك ...
لە سەر لولەی تفەنگە

27/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

دەستورێکی چەند مەندە
خەڵاتنان لە ئەرکی سەندە
بۆ یەکەم مەندە

27/11/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

دەستورێکی چەند جوانە
کە سەرسپی ، دەستی
برۆ سپی ... ماچ ئەکا
بۆ سەر سەری دا ئەبا

27/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

دەستورێکی چەند نایابە
خزم ... و ... کەس ناسین
پێکەوە ... هەڵپەڕین
و ... پێکەوە ... شین

27/11/2015

# مامۆستا ئەڵێ

عاشقی مردن بووم
لە بوونەوەم .. ئەبم ...و...ئەمرم
هەستم پێی ئەکرد ... نەم ئەزانی
ئێستا ...کە زانیم عاشقی بووم
پڕۆسەی دروستکردن ...و... ڕوخانە
سوڕانەوەی وزەو ... هێزانە
بۆ .. مردی ... و ... زندییانە
بۆیە عاشقی بووم
هەمیشە ... عاشقم بوو
لەم .. مەیدانە

15/9/2015

(1)

هەڵەبجە ......

ماستی ترشاوی شەرمەزاری لە نێو

چاوانی ئادەمیزادی

هەڵەبجە ......

خوێتی مەیی دەمارەکانی دڵی مردووی

مرۆڤایەتی

هەڵەبجە .....

قینم لە .... لاوازیمان ... و .... نەزانینمانە

ڕزگارت بکەین ... نەمان توانی

..... و ..... نەت توانی

(2)

هەڵەبجە .....

بۆ گریان .. و .. ڕەشپۆشی و خوێندنی

شیعر

چاك ئەزانین ..... ئەیریێسین

هەڵەبجە .....

ئەنفالەکان ....؟ شەهیدەکان ....؟

کۆمان کەن ..... لە ڕابردوو دەرمان کەن

بۆ ئاینده ... و .... سەربەستی

یەکەمان کەن ....

# مامۆستا ئەڵێ

شاعیرێکی ... کوردم لە دەرسیم
لە مەیخانەی ئەستەنبۆڵ
شیعری ئەخوێند
بە تورکی ... کوردی ناخ
پێم گوت ... منیش شیعر ئەنوسم
گوتی نازانم ... بنووسم کوردی
بەڵام هەستم ڤۆلکانی کوردی
چونکە نەیانهێشت فێر بم کوردی

# مامۆستا ئەڵێ

ماڵ ... ئاوا
کوردستان ... ماڵم بارکرد
هاتم ... بۆ تۆ
ڕزگارت کەم ... لە خەمی خۆم
خەمی ... خەمانی
بە پەتی باری تۆ ...

# مامـۆستا ئەڵێ

چومە .. ناو خۆم
هیچم نەدی بە چاوم
بیر ... و ... بڕوام دی
بە مێشکم

# مامۆستا ئەڵێ

بیر لە هیچ مەکەوە
تەنیا ... جیاوازی
ئازادی سەربەستی
و سەربەستی ئازادی

19/1/2015
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

من هەتیمێکی دەربەدەری بزری
ئەنفالەکانم
ئێستا بوومە ...... نەوزاد
من زیندانی برینی هەناسەی ژەهری
هەڵەبجەم
ئێستا بوومە ...... ئازاد
من لاوازێکی بەخێوکراوی دڕەندەکانم
ئێستا بوومە .... شێرزاد
من کوردستانێکی بە بێ ناو بووم
ئێستا بوومە .... ئادەمیزاد
چونکە .... پێشمەرگەم
و لە زگی دایکمەوە فێربووم

28/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

لە دونیای
سەرسەریاتی
بێ سەرسامی
نابیت

27/4/2015

# مامۆستا ئەڵێ

لە گەنجی ... حەزم ئەکرد
لە ئەمریکا بم
نەم توانی
ئێستا ئەتوانم
نامەویی

27/4/2015

بارانی ڕەش ... لە نەفتی سوتاو
فکری ڕەش ... لە ڕوانگەی داماو
خۆ کوژی ڕەش ... لە دۆزەخی نەبوونی ناو
بووە سێ کوچکەی ... وڵات ....ئاین....
مرۆڤی روخاو
لە ژێر دروشمی ... دوژمنی سێ کلاو

28/4/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

هەر ئەوەندەم زانی ... چومە فرین
کێوە چووم ... نازانی
چیم کرد ... نازانی
ئەزانم ... لە ناو مەرەکەبی قەڵەمی جافم
ئەفڕم ... ئەفڕم ... ئەفڕم
زانیم ... ژانی ... ئازارم
مناڵی ... بوو ....
منی ... بوو ... ؟!

6/5/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەندەم نەزانی
زانینی ئەوەندەم
ئەوەندەی .... دوو ئەوەندەی
زانی ... ؟

6/5/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەندەی ئەزانم
یەك .. لە ملیۆنی .. ئەوەندەی نازانم
بەڵام ... زۆر درۆزنەكان
ئەڵێن زۆرتر ... ئەزانین
چۆن نازانم

6/5/2015

# 
مامـۆستا ئەڵێ

خەڵووزی ڕەش
پەنگری سۆری لێ بووە جاش
جاشی بە بێ مجاش
جاشێتی  لێ بووە ئاش
جاشێتی ئەڕێسی
و ئاردی سپی و خەڵوزی ڕەش
لە تەنور ئەسوتێ سپی و ڕەش
لێی دەرئەچێ جاشی ... مجاش

6/5/2015

ڕەشی .. ڕەشایەتی دەروونی سپی
ڕەشترە لە چاوی شەمشەمە کوێر
دڕندەترە ... لە فایرۆسی إیبۆلا
کوشندەترە ... لە کوشتاری ئەنفال
خودا ... ئەم ڕەشاتیە .. دژی مرۆڤ چیە ؟
تۆ ..دروستت کرد...یان ئێمە
وا ئەزانم .. ئێمە دروستمان کرد
بە ناوی تۆوە ..
نازانم .. ئەزانین
یان .. نا .. ؟!

هەولێر

ڕەش ... بووە ... قاوەیی
بووە ... سۆری ... سوتاو
بەڵام ..نەبووە... سپی
سوتاوەکانی ڕەشایەتی
ئاو ..باران .. خۆڵ ..نایکوژێنی
ئاگر .. ئاگر .. ئەیکوژینی
بەڵام لە قین .. قین ئەزی

6/5/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگا ... خەمم هەڵقوڵانی ئاوی زەریا
خۆزگا ... ئازارم بێ دەسەڵاتی خەونی دونیا
خۆزگا ... ئارەزووم ... تێرکردنی منالّی تەنیا
ئینجا خۆزگەکانم ئەبوونە
ئارەزووی ئازاری خەمم

6/5/2015
هەولێر

## مامـۆستـا ئـەڵـێ

کوردستان ... جێکانت گەورە .. گەورە..
ئەکەم
قورس ...قوڕستر ئەکەم
لە ناو دڵم ئەچینم
وەك دار هەنار
ملیۆنا دەنگی خۆشەویستی
لێی دەربچی

# مامۆستا ئەڵێ

دوێنێ ... هەر دوێنی
یادی ساڵانی مەجبوریتم ئەکرد
کە ساڵان ... ساڵی تر هاتی
من لەوێ نەما بووم
هەستوو ... ئارەزووم هەر مابوو
بەڵام نەمتوانی
بە باباگوڕگوڕی خۆشەویستی
هەڵگیرساو بمینی
نامسوتێنێ ... روناك ئەکا
ژانم .. و .. ژیانم
ئازادم ئەکا لە قینم

25/5/2015

لە بالکۆنی سەرسەرەوەی
ئۆتێلی ... دیڤان
سەیری هەولێری تازە ئەکەم
بیرەوەری ... پەنجەرەی باپیرم
ئەکەم ...
لە قەڵای هەولێر
کە سەیری ... هەولێری کەونم ئەکرد
خودایا ... بپارێزی
ئێمەو .. و ... ئەوانی دێن

9/5/2015

خەونی ... خەیاڵ
خەفەتی .... خەمبارانە
خالقی ... دوزەخ
بەهەشتی بۆ خەلقی خۆی داناوە
بووە بە خەونی خەیالی خەفەتی
خەمباران
بەهەشتی هەشتاو هەشت ملیار روداو
بەخشدار کراوە
لە دونیا ... و ... قیامەت
دۆزەخ .. بۆ ترساندن باسکراوە

1/6/2015
هەولێر

سونبلی ... گوڵە گەنمی قەڵەوی قەراج
بە پیتی خاك ... هەوای نەرم ...
ئاوی ئاسمان
بوینە ... سونبلی خۆشەویستی
خاك ... و ... هەوا ... ئاو
بۆیە گەنم ... تێر ئەكا
خۆشەویستەكان .. لە یەك مەنجەل ئەكا

1/6/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دوایین ... نامەم ئەویە
دواییم نیە ...

1/6/2015
هەولێر

له دەوری ... دووری
ڕۆژ ... و ... زەوی
له ناومی ... ناوی
گوێز ..و.. پەلكی
له ئیسكمی ... له دەرونمی
له خوێنمی
نزیكی شاه دەمارمی

**4/6/2015**
**هەولێر**

# مامۆستا ئەڵێ

زۆرم .. نەماوە ... یەکجاری بنوم
بەڵام ... ئەوەی ماوە
بەش ئەکا ... هیچ نەنوم

4/6/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

قوڕی هیشك
خۆلی رەش
زەماوەندی سەگ
و ... مشك

4/6/2016

له ئاسمان ... هاته خوارێ
گەوارەی تەزرە
لە زەوی ... چۆوە ئاسمان
گەرمی ... ساردی ... بەرزە
چند ... نەزانم
سەگ ... مشك
هەست .. ئەکا پێش من
ئەڵێم مرۆڤم ... بەڵام
زانینی ناوزانم ... لە بیر چۆوە
بۆ ... دروست کردنی خواردنم

4/6/2015

قەڵایەکانی کوردستان
ئاوەدان بوون بە شارستان
بوونە کاولگا ... لە بێ بەهرستان
دوێنێ قەڵای هەولێر
شار بوو ... ئێستا خراپستان
مراندمان ...
ئەگەر بتوانین بکەینە میوەزستان

5/7/2015

موسکو/کرملین

خەنی ... لەخۆم ... لەشم
ئاوی کارێزی میری تیدا مایا
ئاوی کارێزی توره ق
کارێزی یاسین ئاغای
لێ هیشك ... نابێ
لە ناو ... ئیسکانم ... مایا

5/7/2015

موسکو/کرملین

سەرسامم ... پێیان کرا
پێمان نەکرا ...
چونکە لە ناو .. دۆڵ .. شاخ
شاردراینەوە
بۆ ئەوەی نەفەوتێین
بە ئاو ... هەوا ... داربەڕوو
حەواینەوە
لە کێ .. بمانهێنابە شارستانی

5/7/2015
موسکو/کرملین

وەك ... شێر .. گورگ قاودراین
بۆ ناو شاخان
شاخ خاوەنمان بوو
ئازادیمان بوو
كە ویستمان ببینە شارستان
ڕەوشتی شاخستانیمان
بەرانگیر ... بوو
دەبی شاخ بكەینە شار

5/7/2015
موسكو/كرملین

# مامـۆستا ئـەڵـیٚ

خەونەكانم ...
خەون ... ئەبینم
نەوەك ... لەم كورتە ژیانە
بنووم

6/7/2015
موسكو

# مامـۆستا ئـەڵێ

خەوەنەکانم
نەبی خەمی خەونم
هەموو گەرچەکە ژیانم

6/7/2015
موسکوDuty blum

خەونەکانم ...
له خەمباری دۆزینەوەی دوزینی وون
ئازا دوغرەمچیم لێ .. بووە وون
چۆوە ... خەمباری دۆزینەوەی خەونەکان
خەونەکان ... دێن
بەڵام ئازا ... هات .. و .. نەچوو ..

6/7/2015

## مامـۆستا ئەڵێ

خەونەكانم ...
خەڵاتی سەد سالی
قوربانی ... كرد
بە سەد دەقەی ژیان

6/7/2015

خەونەکانم ...
ئازا دوغرەمچی ... و ... بابی
لە ژیان ... هاتنە لام
لە مردن ... چوومە لایان
لام ... و ... لایان
ژیانی ... ژانانکان بوون
خەونەکان .. و .. ژیانەکان
بوین .. و .. بوون

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم ...
خەریکە ... ئەریسن
خەتای .. خۆ خەملاندنی
لە چاوەڕوانی ... ژیانی پێش مردن
و ژیانی پاش مردن

6/7/2015

موسکو

# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستا ... نەوزاد ... ئەڵێ
خەونەکانم ...
لە دەسەڵاتن ... لە من
بەرژەوەندی ... ئازارەکانن
لە ئازاد بوونی ... ئازایی ئازا دوغرەمچی
لە خەونەکانم ... ئەو ئەمنی دی
لە تۆریی ماخۆلیای خۆشی ..
خۆشەویستی
ژیان

6/7/2015
موسکو

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکم .. هەبێ .. وڵاتم
وەك روسیا ... ئەمریکا
هیمن ... ئەمین ... ڕەنگین
خاوەن شارستانی .. و .. زەمین

5/7/2015
موسكو/ساحه الحمراء

خەونەکم .. هەبی , وولاتم
خاوەن دەسەڵات بی
بۆ خۆشەویستی رەهبەر بی
خاوەن خۆی بی ...
ئینجا با بمرم بە ئازادی

**5/7/2015**

**موسکو/کرملین**

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکم .. هەبی .. ووڵاتم
ووڵاتم ... مرۆڤ .. ژینگە هاوبەش بی
مەل .. شاخ .. دار.. برادەر بی
مرۆڤیش ...

5/7/2015
موسکو/کرملین

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکم هەبێ ... وولاّتم
لە بن دەست نەبی
ئازاد ... ئازادی ناس .. و پەروەردە
بەهێز .. ژیر بی
لە کارگەی دەسەلات

5/7/2015
موسکو/کرملین

# مامۆستا ئەڵێ

خەونی نەبێ کەس نیە
خەونی ... مرۆڤ ..
مەل ... ئاژەڵ ...
دڕندە ...
پێداویستیانە
خەونگا ...
پێداویستیانە

5/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم
ئەخەوم ...
هەتا خەون ئەبینم

6/7/2015
مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم ...
هونەرمەندی گەلانمان
هەبێ ...
ئازاری میللەت
بکەنە ... گۆرانی

6/7/2015
مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم
هەژاندنی کارە ساتی
کارە ساتانی
نەزانانی کارە سات

5/7/2015
مۆسکۆ

# مـامـۆستـا ئـەڵـێ

خەونەکانم ...
دوزینەوەی منداڵ لە دایك
بزر بووی
تێر بوونی منداڵ
لە نان ... شیر
قەڵەم ...
خەونیش ئەبینم
ببینە خاوەن
کۆمپیوتەر

5/7/2015
مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

خەونەکانم ...
پێویستی دڕندەکان
نیە .. لە خوێن
فرتو .. فێڵی ڕیویەکان
نیە ... لە فڕاندنی
شیری ... هەوێن

5/7/2015
مۆسکۆ

# مامۆستا ئەڵێ

## ئەتۆم ... نەدیتبایە خۆزگا

17/6/2015

أسطنبول- تقسيم

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کتابی مامۆستا ئەڵێ
ئاوی گوشینی مێشکمە
لە ئاڤێستاوە
هەتا ... هەتایە

17/6/2015
أسطنبول/تقسيم

# مامـۆستا ئـەڵـێ

دەسەڵاتی زانکۆی جیهان
دەرچوانیتی
هەڵگری بڕوانامەی
جیهانیتی

17/6/2015

أسطنبول / تقسیم

1) سەماو ... سەمای دفی قادری
مناڵ بووم ... حەی حەیم کرد
لە تەکیەی قادری قەڵا
2) هەڵاو هەڵپەرکێ..ی.. کوردایەتی
لە نەورۆزانی ساڵانی پێش حەفتا
هەڵاو .. هەڵۆ .. هەڵۆیانم کرد

# مامۆستا ئەڵێ

3)ئازارو .. ئازارم لە مۆسیقا دەرکرد
ئەنفال .. و .. هەڵەبجە پێش یان
نیسانی ساڵی 1975
لە سەر خوێتی خۆم هەڵپەریم
بە بێ مۆسیقا
4) هات ... هات پێش مەرگەی
رزگاری ساڵی 1990 بە ئاهەنگ
بە فیشە ك ... تەقینەوە بەعس

# مامۆستا ئەڵێ

5) هەڵات ... دەربەدەری
خۆ کوشتنی ...
مۆسیقا .. هەڵگیرسا ..
ئاگر ئاگری ... برژاندن
6) پێویستمانە دەف ... دەهۆڵ
ساز بکەین
ئاگری قین .. بشۆین

# مامـۆستا ئەڵێ

7) لە 1991 .. تۆپ دەنگ
مۆسیقای ... نواندن
8) بەڵام هەستی پێش مەرگاتی
دۆڵ و زورنای هێنادی
سەربەستی هەستی مۆسیقا
بووە خۆشەویستی ئازادی
9) 2003 مۆسیقا ئازاد بوو
بەڵام مرۆڤ بووە مەڵبەندی دیلی
دیلی ناوخۆ .. دیلی دەرەوەی خۆ

# مامۆستا ئەڵێ

10) ئینجا چۆن ئەتوانین
مۆسیقا دیل بکەین ... بە ئازادی مرۆڤ
11) بەڵام ... ئێمە لە عیراق
مرۆڤ دیل بووە ..
بە عەکسی ... میللەتی رەشی
ئەمریکا

17/6/2015

# مامۆستا ئەڵێ

دەرمان .. و .. ژەهر .. یەك مادەن
ژیان لە سەر میقدار دانراوە
میزان .. و .. سوودمەندی
لە مادە ... وەرگیراوە
ئەركی ئۆرگانی
پێدانراوە

سەیری سەیوان بە سیوان
وەك سەمای غفرانە لە ئاسمان
هەرکەس  ئارەزوی بی
دێتە خوارێ .. بۆی .. بوك و باران
ئەوەیە .. هێزی رەحمان

**11/7/2015**
**Petersburg/Russia**

# مامۆستا ئەڵێ

هێزی ئاسمان
کەم زانینی ئینسان
دوای خستوە ... خواناسان

11/7/2015
Petersburg air port/Russia

# مامۆستا ئەڵێ

سارد بووم ... لە سارد کردنەوەم
وەك ئەمۆنیا سهۆڵم ئەبەست
ئێستا وەك صۆدیۆم
لە هەوا ئەسوتێم
خۆزگا وەك یۆرانیۆم
بتەقەم
بەڵام لە کێ بینم
صاعقی ژەهری

# مامۆستا ئەڵێ

بۆیە لە بێ دەسەڵاتی
خۆ تەقاندن بووە بیر ...و ...بڕوا
هەتا رزگار بن لە بێ ئاسوودەیی
پێویستمان بە ئەمۆنیای دیموکراسییە
بە صۆدیۆمی زانیاری
بە یۆرانیۆمی خۆشەویستی
هەتا بگەینە ... رادەی مرۆڤ

20/7/2015

لە خەونی خەوا
جار ... بەجار ئەفڕم بۆ ئاسمانی شێتاتیم
ئەپچڕێنم هەوری ترسم
دەڵێم بڕوای مێشکم
ئەزانم ڕاستم
بەڵام ... پێویستە ئەوانی دی بزانن راستم
ئەڵێم...و ...ئەڵێم...و....ئەڵێم
هەتا هەوری ترس ... ئەبێتە باران

22/7/2015

# مامـۆستـا ئـەڵێ

هەندەك مابوو ... بتەزم لە ترسان
ترسی بزر بوون ... لە ناو خۆم
نەدۆزینەوەی خۆم... لە ناو خۆوەکان
ترسم کردە ئاسودەیی ... هێمنی
ئینجا رزگار بووم لە ترسی ترس
ترسم کردە ... مەشخەڵ
بە خۆشەویستی ...؟!

22/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵاتی ... ترسم
هەڵاتنە ... بۆ دەرەوەی ترس
ئینجا ... ئابڵۆقەی ترس بە خۆشەویستی
ترس ئەکەمە خۆشەویستی ... ؟!

# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێن ترس شەرمە
ئەڵێم ترس هەندێکی پێویستە

# مامـۆستا ئەڵێ

سوێند ئەخۆم ...
ترس نیە ... نیە ترس
ئێمە دروستمان کردووە ترس
لاوازی بیر .. و .. بڕوا
ترس ئەکاتە پرس ...

22/7/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ترس .. کردویانە دەرس
دەرسەکانیشیان شاردیتەوە لە ناو ترس
فێرکردنی ترس ...بویتە بیر ..و..بڕوا
فێر ئەکەین ... بێ ئەوەی بزانین
چیە بیرو .. بڕوای .. ترس

22/7/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ترس نیە ... نیە ترس
ئێمە دروستمان کردووە
بۆ ڕاهێنانی ... نەترسان

22/7/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

توانای ئەوەم هەیە
بەرد .. فێربکەم
ئەگەر خۆشم بوێ

2/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

توانای ... تواندنی ئاو
لە هەموو ... توانا ... تواناترە

2/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

تواناى توندى
بە سانايى ئەپسێ ...
ترسى توندى بپچڕێ
زيندانى دەرون ... ئەبەزيى

2/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

زیندانی ڕەشبیری
خوێن مژە
دژی ... روناکییە

2/8/2015

هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری کەن ... جوانی مەل
هەستی کەن ... بۆنی گەل
ئازادی کەن ... سەربەستی دڵ
سەیرانی کەن ... لە مێرگی چڵ
مەل ..و..گەل..و..دڵ..و..چڵ
سەما ..ئەکەن لە ئاوازی ..؟!

2/8/2015

ره وشتی .. ئاوی .. ئاسمان
هەڵگری .. مەشخەڵی .. کوردستان
فیشه کی ... بڕنۆ
ئاهه نگی .. من .. و .. تۆ
ئازاری .. قەندیل
ئاواتی ... نەزاندراو
یەکیان گرت .. کوردستان .. یان ئاوەدان

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئاو .. نەرمە .. رەقە .. هەڵمە
کوردو ... کوردستان
وەك ئاوە ...

2/8/2015
هەولێر

## مامۆستا ئەڵێ

مشك .. و .. مریشك
كانی ناو .. ناوەم
بوونە سەگ
ئەخۆن .. ناوی .. ناوەم

2/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

فینك ... بووم بە ئاوازی ژانم
کوڵام .... بە نەزانینی مافم
لە ناوەندی فینك .. و ... کولانم
ژانم .. بووە .. مافم

4/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەیری کەن ... چەند فێنکە
هۆشمەندی ... روناکبیری ... سەرفرازی
بە .. هاوین .. زستان
وەك بەهار ... پایزە
هەموویان ... فێنکە ..!؟

4/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئاگر ئەسوتێنم
بە ... بەفر

4/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئـەڵێ

فێنك .. بوو زامم
بە سوتانی ... ناخم
چی ناخم فێنك بۆوە
چی سوتا ... زامم
ژیام ... لە ... لاوازیم
پیشانم دا ... هێزدارم
بە بەكارهینانی ... لاوانم

4/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

فێنك ... چندساڵە
ژیانم ... ئەکەی فێنك
وەك ئەمۆنیا
کە لە خۆم ... تورە ئەبم
لە بێ دەسەڵاتی ... دەربەدەر ئەبم
هەوای ساردی خۆشەویستیت
ئەبێتە فابریکەی سەهۆڵ
بۆ فێنك ... کردنی .. هاوینم

4/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

فێنکی ... سەری سەکران
گەرمای ... قەرەچوغ
شیوازی ... جۆرەیی
جۆرکرد

4/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

فێنك ... ماستی مەڕی
تیمار ئەكا ... سوتانی
بی سەروەری

4/8/2015
هەولێر

چنین ... ڕێسینی تەشی
لەرێ مازی ..؟!
جۆلا... ئەچنی بەرماڵ
بە ڕێسینی تەشی
ئارامی جۆلا ... تەشی ڕێسانی
پلە ... خەجی
ئاسودە ترە .. لە بێ ئاسودەیی ئارامی

6/8/2015
هەولێر

چنینی ... پێم ئەڵێ
یان ... شێتی ...؟
یان ... شێتاتی بە عاقڵی ئەزانی
راستە .. هەم شێتم ...
هەم عاقڵ بە شێت ئەزانم
ئەمەیە ... کارەساتی چنینی
بەرمالی ... عەقل

6/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوانەی ...
درۆ ... ئەڕێسن وەك تەشی
ناتوانن كاری باش بچنن
درۆ ... ئەڕێسی
بەڵام ... ناتوانی بچنی

6/8/2015

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئای ... چنین
ئێستا ... لە کوێی ؟!.......؟!
خۆزگا .... بمهێشتبای
ژیانم بچنی

6/8/2015
هەولێر

چنین ... چەندم پێ گۆتی
بچیە ... خۆشەویستی
بۆ .. خۆت .. بۆ .. ژیان
بۆ ... خۆشەویستی ... مطلق
بکوژینەوە .. نەیزەکی ئاسمان
بە خۆشەویستی ژیان
بە هەوای سارد
فۆلکانی نەیزەك ... بکە ئارد

6/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دەرونێکی ساف
رەوشتیکی ... پاك
دڵ پاك ئەکا .. لە بزاڤ

6/8/2015
هەولێر

## مامۆستا ئەڵێ

سامانی .. دونیا .. و .. قیامەت
ئەچەسپێنی مافی .. هەبوون .. نەبوون

6/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگا ... خۆزگا
سوپاس ... سوپاس
مامۆستا ... بوو

6/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

چنین .. بێ تۆ ئێواره
هەروەك .. مەیخانەی بێ شەرابه

6/8/2015

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەرسامی ... بی هۆشداری
هۆشمەندی ... مامۆستایانە
مامۆستای قوتابی ... قوتابییانە
وە ... مامۆستا ...قوتابی
قوتابییانە

6/8/2015

دونیای ... داد
هەڵسەنگاندی ... لە ... بێ ... داد .. یە
نیتمان داد ... لە سەر زوەی
پەنا ئەبەین ... بڕوا ئەکەین
لە ئاسمان ... ئەبینین داد
پێم .. وایە .. چی لە ئاسمان ئەبینی
چی ... چی لە زەوی
ئەو .. دادەی .. ئێمە ئەمانەوێ

## مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کارەسات لە داد نیە
کارەسات لە سودمەندانی داد

10/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

داد ... داد
بمان پارێزە
ئەی کێ ئەپارێزی داد

10/8/2015
هەولێر

داد .. داد .. و .. داد
بێ دادو .. داد
لە سنور بەزانی داد
ئەوان داد ئەیانپارێزی
هێزی داد ... بۆ ئەوانەی ... بڕوایان پێیە
هێرشی دژیان ... لە ئەستۆیە
داد .. بیرو .. بڕوا بکە
بی پارێزی ... ئەتپارێزی

8/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

سەنگەری داد ...
قەلغانی .. بیرو .. بڕوایە
خۆبەخشی تاك .... بۆ كۆمەڵ
و پاراستنی تاك ... بە كۆمەڵ
ئاسودەیی دادە ...؟!

10/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

داد .... دادە ... دۆی لە ژێردا رژاوە
ژێر داد .. و .. سەرداد
سەرتۆی لێ وەرگیراوە
داد .. هیچ .. بۆی نەماوە

10/8/2015
هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

داد ... ئی هەژارو ... دەوڵەمەندە
بە بینینیان ... داد سوڕانە

10/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

داد ... ئەڵێ
برۆ .. برۆ .. ئارەزوی
عقابتم نیە ...
چاك بونت ئامانجمە

10/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەگە .. هارەکان
دەبێ ... بە داء الکلب بمرن
و نەهێڵین کەس بگەزن

10/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەگە هارەکان
هاریان لە نەخۆشی خۆیانە
نابێ بهێڵین ... ئی دی نەخۆشی بێ
لە هاریان ...
هاری ... بۆ هاران

10/8/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

## سەگەکان ... سەگیان نیە پاسەوان

11/8/2015

هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەگەکان ... ئەوەڕن
ئەحەپن ... کە گەیشتنە دێوخانە
چاوەڕوانی ئێسکی پەراسوی
پاشماوەکانن

11/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەگەکان ... گورگ ڕەوێنن
مشك هەوێنن
وەفایان ..
بۆ ئێسکەکەی خاوەنی
ئێسکەکانیانن

11/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

سەگەکان ... سەگاتیان
پێ چاندراوە

11/8/2015
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەگەکان ... هارییان
دەرمانی نیە
خۆت ... بپارێزە لە هاران

11/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەگەکان ... سەرسامیان
لە هاری خۆیان ...
سەگ ... بوینە ..؟!
بۆ .. سەگەکان .. و
بۆ .. زیندەوەران

11/8/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

سەگ ... سواری سەگ
سەگاتیان ئەبێتە مەرگ
بۆ خۆیان
و بۆ دڵی ... تەنگ

11/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەگ ... ئەڵێن وەفای هەیە
ئایا ... بۆ سەگایە تی
یان بۆ پێویستیی
وا .. ئەزانم .. هەردوکیان
بەڵام زۆر شت نازانین لە سەگایە تی
بەڵام ... سەگ ئەزانی
لە مرۆڤایەتی

11/8/2015
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەگ ... سەگایە تی سەرسامی
مرۆڤایەتی
بەڵام مرۆڤایەتی نیە سەرسامی سەگایەتی
مرۆڤایەتی ... سەگایەتی
بەینیان نەزانینی سەرسامێتی

13/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەگ ... سەنگەری وەفایی
بەڵام وەفایەتی بۆ پێداویستی
نەمەرگایەتی

13/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

سلاو .. لە بەرەکەتی سلاو
بە جێ ماو .. لە دۆزەخی دراو
بەهەشتی ئارامی ... ئەکاتە بلاو
لە سەرسامی ... ناو ...

17/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئای ... ئای ... ئای
لە لافاوی ئاوی لەشم
لە ناو ... ئاوم ... خنكام ...سۆتام
بۆیە ... ناوێرم ناخم ببەمە ناو لەشم
با بسوتێ لەشم ... بخنكی ئاوم
تا .. رزگار .. بێ .. ناخم

17/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دایە ... گیان
دامنا وینەت ... لە جیگای خیراتم
فۆلگانی خۆشەویستیت
بویتە .. سەهۆڵ
لە ژانی دەربەدەری ناخم
منت هێنا ... ژیان
دەسەڵاتی ژیان .. و .. ژینبەر
بویتە هاوکاری ... خۆشەویستی
لە هەموو .. کات .. بێ کات .. ویستی

19/8/2015
هەولێر

قەبۆڵم بکەن ... من شێت بویمە
چونکە ... شێتایەتی بویتە ئامانجی
دیموکراسی
دیموکراسی ... رۆلە ... بەرەلایی نیە
دەربەدەری ناخی کۆمەڵ نیە
ئارەزوی ... نا زانایانی ئەرز ... نیە
قەبولم .. بکەن .. من شێت بویمە
چونکە .. کۆمەڵ لە گەڵمانە هار .. بووە
هەمووامان .. هار .. هار .. هار .. بووین
هاریمان .. تەنیا .. خۆمان هارتر .. ئەکا

19/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەم داران ... خەمتان بوە خەرمان
چی ئەکەن .. لە خەمی خەرمان
بسوتێنن ژان
بروخێنن بان
هەرگیز .. نابنە خاوەنی .. خەرمان
خەرمان .. دەبی .. لە چاندن
ئاو ..و .. ئاو .. دان
با .. زیادە .. بی .. بۆ .. کۆگای خەرمان

19/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئـەڵـێ

هێزم .. لە هێزی مۆسیقای ژەنگ
بە ڕەنگ .. و .. دەنگ
بوینە .. هێزی .. سەنگ
سەنگ .. ڕەنگ .. ژەنگ
بونە ... هێزداری ... دەنگ

19/8/2015
هەولێر

# مـامـۆستا ئـەڵێ

هیزی .. مردن .. مراندنی لە دوایا
مراندن .. لە هێزی مردن جیایە

19/8/2015
هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

نازانم .. چی .. بڵێم لە نەزانینم
هەرچی ... مامۆستایشم

19/8/2015
هەولێر

کتاب ... دەرمانە
چیە ..! چی دەرمانە
خواردن .. دەردە .. و .. دەرمانە
هەوا .... ئۆکسجینی زۆر بێ دەسوتێ
نزم بێ ... ئەنوێ
ئینجا ... دەرمانە
دەرمانی دەرمان ... ئەوەیە
پێوەری پێویستی ... بدۆزێتەوە

20/8/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز ... ناسوتێنێ
چونکە ... سوتاوە
بەڵام بیسوتێنی
یان گەرم ئەکا
یاخود ... ئەسوتێنێ

د. نوزاد يحيى سعيد
23/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەرمانی ... نەوتە
خەزێنەی ... پاشەکەوتە
بۆ ژیان ... دەسکەوتە
تەرازووی میزانی
تەرزە

د. نوزاد یحیی سعید
23/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز ...
خاوەنی خیابانی
خاوێتییە

د. نوزاد يحيى سعيد
23/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز ... خوناوەکەی
پاودەر ...
خوناوی ... خەندەوانی
ڕەگی مردووی

د. نوزاد یحیی سعید
23/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز ... خاوەری خاوەن خەونە
خەرمانی ... خۆپیشاندانی خەمە
خەڵوز ...
لە بەفر سپیترە ...
وزەی لە ناو سپاردراوە
وزەش ... هەموو ڕەنگدارە

د. نوزاد یحیی سعید
25/2/2015

ئەم دی لە ئاسمان بەختیاری
گشت بەختیاری
لە ژیان ... ژیاندوومانە
ئەوانی تر ... نازانن
بەختیاری

د. نوزاد یحیی سعید
25/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ هێزێکم هەستنەکردووە
هیچی لێ دەرنەچێ

د. نوزاد یحیى سعيد
27/2/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

هیچ نییە ...
هیچی بە کەڵك نەبی

د. نوزاد یحیی سعید
27/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ ...
نرخی دانانی بوون
یان نەبوون

د. نوزاد یحیی سعید
27/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ هەنجەتی
نەبوونە ...
پڕشنگداری ... بوونە
ئایندەی سەر زەوی
هیچە ...

د. نوزاد یحیی سعید
27/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ ... بێ سوود نییە
سوودی جیاوازی کردنی
سەرەوە .. و .. بنەوەی هیچە

د. نوزاد یحیی سعید
27/2/2015

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هیچ ... قیمەتی ماتماتیکی
بەنرخترە
لە هیچاتی ... هیچ

د. نوزاد یحیی سعید
22/4/2015

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مێشك ... شەو .. و .. ڕۆژی نییە
ڕوانگەی فڕینی هەیە

د. نوزاد يحيى سعيد
22/4/2015

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

## دەسەڵاتی مێشکم
## هێزی دروستکراوی خودایە

د. نوزاد یحیی سعید
22/4/2015

# مامۆستا ئەڵێ

سەنگاندنی ... سەنگ
هاندانی ... جەنگ
جەنگی فڕینی هەنگ
بۆ دروستکردنی هەنگ
بە بەهاترە ...
لە فڕینی فڕۆکەی نەبینراو

د. نوزاد یحیی سعید
24/4/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

شەپۆلی ... زەریای خاو
گەردەلوولەی ... فرتەنەی ئاو
لافاوی فیکری تێکەڵاو
تێکەڵی کرد ... با .. و .. ئاو

د. نوزاد یحیی سعید
24/4/2015

# مامۆستا ئەڵێ

خەون خەونداری خەواندووە
لە خەونی فیکر
ئەژین بۆ ڕووناکی بەهەشت
بەهەشت لە دەستیانە
بەڵام نازانن
بەکاری بهێنن .. و .. بژین

د. نوزاد یحیی سعید
24/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

له خەونی ژیانی پاش ژیان
هەروەك ژیانی پاش مردن
خەونه .. فکره .. بڕوایه .. بیره
یان ... هیچیانه
بۆ .. مرۆڤ ... وا بیر ئەکات
له هەنگ له ئاژەڵ
له بەرد .. له هەوا
له دار ... له بەکتریا
هەموویان ... مێشکیان
له مرۆڤ ...
بەرزتره ...؟ ؟!

د. نوزاد یحیی سعید
24/2/2015

# مامۆستا ئەڵێ

شاردمەوە ژانم
لە ناو ... مانم
بۆیە ... ماوم

د. نوزاد یحیی سعید
24/2/2015

بڕوام وایا ... ئەزانم
خوا ... ناسی چیە
جیاوازام ... لەوانەی
بیر .. لە گەورەیی
خودا ... ئەکەن
بە مێشك .. و ... فکری
مرۆڤ

20/9/2015
اسطنبول

خودای گەورە ... خولقێنەرە
ئاینی ... بۆ مرۆڤ دانا
ئێمە ... بۆ ناسینی
لە مێشکمان ... چاندراوە
پێویستە ... بیچێنێن
ئاوی بدەین
بیدورین
ئینجا ... بیخۆین
ببێتە ... ئینێرگی
بیر .. و .. بڕوامان
بۆ ... خۆشەویستی
خولقاوەکانی

20/9/2015

اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

له ... دەرەوەی وڵات
ئەزانم .... چەند دەربەدەرم
له ئازادی ... بێ زانین
له فڕینی ... ناو نەزانین
له دەرەوەی وڵات
ئەزانم ... چەند دەربەدەرم
بۆیە ... وڵاتم ئەیێتە
خەڵاتی ... کۆرەکان

**2/10/2015**

اسطنبول

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مامۆستای جەرگ سوتاو
دەردی ژانی نەماو
مانگی هێزی ... زانستی دروستکراو
هەموویان ئەبنە ... بناغەی چاو

2/10/2015
اسطنبول - استقلال

# مامۆستا ئەڵێ

چونکە دەوڵەتم نیە
دونیام کردە وڵاتم

6/10/2015

اسطنبول

# مامۆستا ئەڵێ

عاشقێکم ... عەشقم لێ ڕژاوە
بۆ خۆشمی  نەماوە
عەشقی .. وڵاتێکی وونم
هەستێکی بزرم
لە ناوخۆم دەربەدەرم

ماڵ درێم سیتی
15/10/2015

لیمۆ ... پێکی شین
هەنار ....ێکی ڕەش
ویستم بیانکوشم بۆ شەربەت
چی لیمۆ .. ما .. چی هەنار
بوونە ... مونار
........ لیونا
....... هەموو
هەموو .. بوونە هەموو

ماڵ درێم سیتی
15/10/2015

# مامـۆستا ئـەڵـێ

تام .. بۆنی تازە
وەك ... ژیان .. و .. ژیانەوە

28/10/2015

اسطنبول – تقسیم

له تاريكه شەو
بروسكمی
له ... بەفر بارين
ساماڵمی
له ... دوور
نێزيكمی
هەرچەند بباری
تێنووتم

28/10/2015

اسطنبول – تقسيم

ئەی خەڵوزی سپی
پڕشنگدار
خۆشەویستیت بە تەمەنترە
لە ئەڵماس
بە هێزترە
بە تینترە
بە نرخترە

**28/10/2015**

**اسطنبول – تقسيم**

ئەی خەڵوزی نەسوتاو
پارچە یە کی لە .... هەتاو
بۆ ... نەمای لە ناکاو
کات .. و .. زەمانی ڕوخاو
هاتنە داخوازیت
ئەی پرشکی ... هەتاو

28/10/2015

اسطنبول – تقسیم

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

ئەی خەڵوزی سپی
لە سنگت دڵم ئەبینم
لە خەندەت خەون ئەبینم
لە ناو خوێنی
شاە دمارت خنکاوم

28/10/2015

اسطنبول – تقسیم

# مامـۆستا ئـەڵیٚ

ئەی خەڵوزی بەرد
لە چاوت خۆم ئەبینم
لە بەرەکەت
جوان ئاسمان ئەبینم

28/10/2015
اسطنبول – تقسیم

# مامۆستا ئەڵێ

قەیرانی ... نەبونی قەیتان
قەبارەی ... قاسمەکان
ئەپچڕێ
قەیرانە .. قەبارەی قەیتانی
قاسمەکان

28/10/2015

اسطنبول – تقسيم

# مامۆستا ئەڵێ

دڵۆپە دڵۆپە
خوێنم ... لێ ئەڕوا
هەستی پێ ناکەم
گەوارە ... گەوارە
ئاوم ... لێ ئەڕوا
دیسان نازانم
ئینجا لە ڕۆیشتنم
دڵۆپە بێ ... یان
گەوارە ...
فەرقی چیە ...؟!
خوێن ... و ... ئاو ..؟

29/10/2015
اسطنبول - مسهاتن

# مامۆستا ئەڵێ

دڵۆپە ... دڵۆپە
گەوارە ... گەوارە
گەوارە ... دڵۆپەیە
کامیان ... ڕاستە ..؟
هەموویان ... ڕاستن
فەرقییان ... خێراییان

29/10/2015

اسطنبول - مسهاتن

دڵۆپە ... دڵۆپە
هێمنی چالاك مەندی ...
گەوارە ... گەوارە
بارینی ... ئاوی بۆ دەریا
شەپۆلی شەیتان
خۆی لەناو ... شەپۆلی
خنکا

29/10/2015

اسطنبول – مسهاتن

# ماموٚستا ئەڵێ

دڵۆپە ... دڵۆپەی دەلو
دڵ ... ئەسوتێنی
لە هەو ... لە مەو
چیە هەو ؟ چیە مەو ؟
دڵۆپەیە هاتە خوارێ
لە دەلو بۆ .. دەو

**29/10/2015**

**اسطنبول - مسهاتن**

دڵۆپە ... دڵۆپە
دڵۆپە ... جەرەی ئاو
پڕ ئەکا ... ئاو
لە دەرەوەی ... داو
دور لە شەیتانی
بێ ... چاو ..؟

29/10/2015

اسطنبول – مسهاتن

دڵۆپە دڵۆپە
خۆشەویستی ... ئەمژین
گەوارە ... گەوارە
قین ... ئەجوین
قین ... ئەڕوێنین
بۆ قەیتانی
شەیتان

29/10/2015
اسطنبول – مسهاتن

# مامـۆستا ئەڵێ

ئەی بەردی ورد
دەربەدەری ....
دەربەدەرستان
کۆ بن لە ئاسمان
ببنە دەنکە تەسبیحی
زیکری ... خودا

28/10/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

ڕقمان لە عارەب
تورك ... فارس نەبێ
ڕقمان لە نەزانی
و .. لاوازی .. قینمان بێ

25/10/2015

# مامۆستا ئەڵێ

کەی دێتەوە ...
کەی دێتەوە ...
کاتی پیریم کەی دێتەوە
پێی بڵێم ... گەنجەکان
... جەنگەکان
چیان لێ کردووم

25/10/2015
اسطنبول - سفیر

# مامـۆستا ئـەڵـێ

سەیری مەرەکەبی ناو قەڵەمم
بکەن
هە میشە ... ئاو .. و ... ڕەنگە
بە دیقەت سەیری بکەن
ئەیبینن .. هەستە
لە .. وون بوون ... مەستە

25/10/2015

اسطنبول - سفير

لەت .. لەتم کەن
لە زیندانی ... ناو ناوم
ڕزگارم کەن
ئینجا ... ئاوی مەرەکەبم
بە خوێتی شەهیدانم
ئازاد نامەمان
بۆ ... ڕەوان کەن

25/10/2015

اسطنبول - سفیر

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی خەڵوزی زەرد
بە تینتر .. لە بەرد
بە هەستر .. لە عەرد
ئاوازت ... لائەبا دەرد
دەردت دەرمانی سەرد

28/10/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی خەڵوزی سۆر
گەرمای ئاگرت خۆر
ئەژیێنی بەردی مۆر
تۆ .. خودا
بمبە ئاسمانی دوور

28/10/2015

اسطنبول ـ تقسيم

# مامـۆستا ئەڵێ

له دووتم ..... له دووتم
لێت ئەگەڕێم
له ژێر سێبەری دارەکانی
بەهەشت لێت ئەگەڕێم
له قرچه قرچی سوتانی
لەشم له دۆزەخ
هەر لێت ئەگەڕێم

30/10/2015
Rena_Istanbul

# ژیاننامە

## د. نەوزاد یەحیا سعید خدر ئەلیاس محەمەد باجگر

١) لە رۆژی ٢٨ شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی زایینی لە هەولێر لە دایکبووە.
٢) باوکی یەحیا سەعید باجگرە و دایکی مەکییە ئەحمەد سەمەد سەعدوڵایە، سێ براو و چوار خوشکی هەیە.
٣) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی فەیسەڵییە و دواتر لە ئەربیل ئولا ئیبن خەلەکان بە زمانی کوردی تەواوکردووە، مامۆستایان ناسح داود لە (حساب) بیرکاری و فوئاد موعەلیم لەوێتەکێشان یەکەمین مامۆستای ئە و قۆناغەی بوون.
٤) قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی هەولێر خوێندووە و مامۆستا(مەکی) یەکەمین مامۆستایی خوێندنی ناوەندییەتی.
٥) قۆناغی دواناوەندی، لە دواناوەندی هەولێر تەواوکردووە، مامۆستا خەلیل عەبدوڵلا یەکەمین مامۆستای ئەو قۆناغەی بوو.
٦) لەپایزی ساڵی ١٩٦٧ لەکۆلێژی پزیشکی ـ زانکۆی موسڵ وەردەگیرێت.
٧) ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات و دەبێتە پزیشك.
٨) ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەبێتە پزیشکی نیشتەجێ و پاشان سەرۆکی پزیشکانی نیشتەجێ.
٩) ئەندامی بەشداری یەکێتیی نووسەرانی کورد بووە لەبەغدا ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.

١٠) لەساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ ڕاژەی سەربازی ئیلزامی دەیگرێتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی (زاخۆ، هەولێر، رواندز) وەك پزیشکی سەربازی دەست بەکاردەکات.
١١) ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ وەك پزیشك لەگوندو ئاواییەکانی ناوچەی گەلاڵە خۆشترین ساتەکانی ژیان بەسەردەبات.
١٢) وەك پزیشکی پسپۆری گشتیی لە مستەوسەفی سێتاقان لەهەولێر دادەمەزرێ.
١٣) دەبێتە پزیشکی ئێمرجنسی لەنەخۆشخانەی کۆماری لە هەولێر.
١٤) دەبێتە پزیشکی ڕاهێنەر لە نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن و پاشان نۆرینگەی تایبەتی ئێواران دەکاتەوە.
١٥) یەکەمین سەنتەری نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن لەکوردستان و لە هەولێر دادەمەزرێنێ، لەگەڵ د. ولید خالد لەنەخۆشخانەی جمهوری ساڵی ١٩٨٢.
١٦) لەوەزارەتی تەندروستییەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا - کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدیین ١٩٨٣.
١٧) ڕاهێنانی نەشتەرگەری دڵ وسیینگ لە - مدينة الطب - لەبەغدا ئەنجام دەدات لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا یوسف نعمان ساڵی ١٩٨٣ و لێکۆڵینەوە لە پسپۆری نەشتەرگەری دڵ و سینگ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٧ ، زانکۆی بەغدا – مدينة الطب، لە نهۆمی نۆیەم، چوار ساڵی لێکۆڵینەوەیی و ڕاهێنان لەوێ تەواو دەکات.
١٨) دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە - مدينة الطب، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدا لەتشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ دبلۆمی باڵای نەشتەرگەری دل و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن وەردەگرێت.

١٩) دەگەڕێتەوە شاری هەولێر  وەك پزیشكی پسپۆڕی نەشتەرگەری دڵ وسینگ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی سەلاحەددین دەست بە كاردەبێت.
٢٠) وەك پزیشكی پسپۆر لە نەخۆشخانەی (رزگاری) لە هەولێر لە سالآنی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ دەست بەكار دەبێت.
٢١)ساڵی ١٩٨٨ دەگوازرێتەوە بۆ كۆلێژی پزیشكی زانكۆی موستەنسەرییە، نەخۆشخانەی یەرموك، عیادەی پزیشكی تایبەتی خۆی لە بەغدا شەقامی مشەجەر، باڵاخانەی باقر ئەلباقر دەكاتەوە هەتا ١٩٩٦.
٢٢) ساڵی ١٩٩٦ ئەچێ بۆ توركیا و مێرسین.
٢٣) پرۆسەی هونەری شێوەكاری لە خانوی تایبەتی ـ ژوری وێنەكێشانی خۆی لە كۆمەڵگای سولی لە لێواری دەریای ناوەست دەسپێكردوە.
لەبواری هونەری تەشكیلی(٢٢٠) تابلۆی هونەری تەشكیلی كێشاوە.
لەبواری شعریشدا چەندین شیعری ئازادی كوردی و عەرەبی نووسیوە.
٢٤) سالێ ٢٠٠٣ دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیران لە شاری هەولێر، چالاكییە خزمەتگوزاری و بازرگانی و زانین و زانستییەكانی پەرەپێدەدات، لە تەواوی شارەكانی كوردستان و عێراق دا چالاكانە خزمەتگوزارییە زانسستیی و بازرگانییەكانی گەشە دەكەن.
٢٥) بەشداری دەكات لە پرۆسەی بوژاندنەوەی ئابوری و وە بە رهێنان لە كوردستان و عێراقدا.
٢٦) چەندین كۆمپانییای جیهانی لە دوبەی، مێرسین، عێراق، سریلانكا و بەریتانیا دادەمەزرێنێ.
٢٧) ساڵی ٢٠٠٧ زانكۆی جیهان ـ هەولێر دادەمەزرێنێ.
٢٨) سالی ٢٠٠٩ بانكی جیهان بۆ وەبەرهێنان لە عێراق   دادەمەزرێنی.
٢٩) قوتابخانەی جیهان بۆ سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دادەمەزرێنێ.

٣٠) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان ـ بۆ ئاوەدانکردنەوەیە.
٣١) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری جیهان ـ بۆ خزمەتگوزاری نەوتە.
٣٢) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری خێرخوازی حاجی یەحیایە.
٣٣) دامەزرێنەری ئێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیهانە لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨ .
٣٤) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ سلێمانییە لە ساڵی ٢٠١١.
٣٥) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ دهۆکە لەساڵی ٢٠١٣.
٣٦) دامەزرێنەری مەڵبەندی راوێژکاری و توێژینەوەی زانستیی و یاسایی جینۆسایدە.
٣٧) دامەزرێنەری یانەی وەرزشی جیهانە لەساڵی ٢٠١٠ .
٣٨) ئەندامی کۆمەڵەی جیهانییە بۆ نەشتەرگەری دڵ.
٣٩) ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیاییە بۆ نەشتەرگەریی دڵ.
٤٠) ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکان، رۆژنامە نووسان، ژووری بازرگانییە.
٤١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتیی گیانەوەرانە.
٤٢) دامەزرێنەری کۆمەڵەی پاراستنی ژینگەیە.
٤٣) خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری زانکۆی جیهانە.
٤٤) تا ئێستا دەیان کتێبی چاپکردووە، لەوانە: (ووشە دەچێنم، ازرع الکلمات ، في الله، الموت، پێشمەرگە، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا(١٠بەرگ)، الالبوم فن التشکیلي ، زنجیرە پەرتوکی مامۆستا ئەڵێ ...).
٤٥) چەندین کتێبی تازەی ئامادەی چاپە لەوانە (ئاشتی، لیلا، هزر ...).
٤٦)سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمینداریەتی زانکۆکانی جیهانە (هەولێر، سلێمانی، دهۆك).
٤٧) سە رۆکی ئە نجومە نی ئە مینداریە تی زانکۆی (ئەربیلی نێودەوڵەتی)یە.

٤٨) دامەزرێنەری (ئەکادیمیای جیهان)ــە بۆ پەرەپێدان و فێرکردنی پیشەیی.
٤٩)کۆلێژی قەڵا بۆ دیراساتی ئاینی لە ساڵی ٢٠١٨ دادەمەزرێنێت.
٥٠) لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی وەبەرهێنەرانی کوردستانە.
٥١) ئەندامی ڕێکخراوی ئاشتی جیهانییە، رۆژی (٢٠١٦/٦/١٤) دەبێتە باڵیۆزی ئاشتی جیهانی لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانی کە لە تونس بەسترا.
٥٢) پرۆژە ئایندەییەکانی بریتین لەمانە:
١) دامەزراندنی تۆڕی زانکۆکانی نێودەوڵەتی(International Network of Universities) بە مەبەستی بوژاندنەوە و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لە نێو گە لاندا.
٢) کردنەوەی زانکۆ لەشارە گەورەکانی عێراق و کوردستان.
٣) خوێندنی مافی منداڵان و ئافرەتان لەقوتابخانەو زانکۆکاندا.
٤) بڵاوکردنەوەی پرۆژەی نا بۆ توندووتیژی خێزان، ئافرەتان، منداڵان.
٥) دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری جیهان و پاشان کردنەوەی کۆلێژی پزیشکی و دەرمانسسازی و پەرستیارییە.

بڕوام وایە (تەنیا چارە ... زانین و کارە)

"The only solution is education"

پزیشکی ڕاوێژکارییە، هونەرمەندی تەشکیلییە، شاعیرو بزنسمانە.